# مەرگ

## نووسەر: سادق هیدایەت

## وەرگێڕان: میلاد خزری

ئەح! وشەیەکی ترسناک و بەسام! بە بیستنی هەستێکی دڵتەزێن و هەناوهەژێن وەکوو مژ مرۆڤ دادەگرێ. بزە لە لێو دەسڕێ. شادی لە دڵ دەرنێ، تاریکایی و خەمۆکی دێنێ، هەزار بیرۆکەی پەرێشانەوەبوو بە پێش چاودا دەگێڕێ.

ژیان لە مەرگ جوێ نابێتەوە. تا ژیان نەبێ مەرگ نابێ و هەروەها تا مەرگیش نەبێ ژیان ناتوانێ هەبێ. لە ئەستێرەکانەوە تاکوو بچوکترین شتی سەر گۆی زەوی زوو یاخود درەنگ دەمرن: بەردەکان، گیایەکان، هەرچی بوونەوەرە ... هەرکامیان یەک‌بەدوای‌یەکدا دەبن و دەرەنجام بارگەیان بۆ دواهەوار تێک‌وەردەپێچرێ و بە دەستی فەرامۆشی دەسپێردرێن.

زەوی گوێ‌نەدەرانە درێژە بە سووڕانەوەی خۆی لە ئاسمانی بێ‌بندا دەدا. سروشت لەسەر پاشماوەکانیان دووبارە ژین دەست پێ دەکاتەوە. هەتاو ڕووناکی دەداتەوە. شنە هەڵدەکاتەوە. گوڵان عەتر دەپڕژێنن. باڵندەکان دەجریوێنن و هەرچی زیندەوەرە  باس لە بوونی دەکا.

ئاسمان پێدەکەنێ، زەوی پێ‌دەگەیەنێ و مەرگیش بە داسی کەونینەی کلۆشی ژیان دەدروێنێ.

مەرگ بە چاوێک سەیری هەمووی ژیوار دەکا و چارەنووسیان پێک‌دەگەیەنێتەوە؛ نە هەبوو دەناسێ نە نەبوو، نە بەرزی نە نزمی. لە گۆڕی تەنگی مرۆڤدا گیا و بوونەوەر پێکەوە دەنوێنێ. تەنیا لە گۆڕستاندا خوێن‌خۆران و خوێن‌ڕێژان دەست لە ستەمیان هەڵدەگرن. بێ‌گوناهان ئازار نادرێن. نە چەوسێنەر هەیە نە چەوساوە. گەورە و بچووک لێی خەوتوون. چ خەوێکی ئارام و خۆش، وا سپێدە نابینن. هەراوهوریا و هەڵاوهەنگەمەی ژیان نابیستن. باشترین پەناگە بۆ دەرد و غەم و ڕەنج و هەموو ستەمی ژیان. ئاگری حەزوخولیا ئاوی پێدادەکرێ. هەمووی ئەم شەڕ و کێشە و کوشتار و بگرەوبەردە و گرِوفری مرۆڤ لە ژێر گڵێکی تاریک و سارددا دادەمرکێن و تۆتکە دەگرن.

ئەگەر مەرگ نەبایە، هەمووکەس ئاواتی بۆ دەخواست. هاواری نائومێدی بەرز دەبووەوە. تفیان لە سروشت دەکرد. ئەگەر ژیان ڕانەبردرابایە چەندە تاڵ و ترسناک دەبوو.

ئەو دەمەی کە تاقیی سەخت و دژواری ژیان پفی لە چرای جەوانی کردوە، کانی میهرەبانی وشکەوە بوە و ساردی و تاریکی و ناحەزی داوێنگر دەبن، هەر ئەوە چارەدۆز، هەر خۆیەتی داڵدەدەری باڵای چەماو، سیمای پرگنج، لەشی دەردەدار لە خەوگەیەکی ئارامدا.

ئەی مەرگ! تۆ کۆتاییپێهێنی غەم و پەژارەی. سەروساماندەری سەربەهەش و بەختڕەش و ڕۆژڕەشی. تەواوکەری خەمباری و نائومێدی. چاوی بە فرمێسک دەسڕی. تۆ وەکوو دایکێکی میهرەبانی کە دوای ڕۆژێکی تۆفانی منداڵەکەی لە باوەش دەگرێ و نازی دەکا و دەیخەوێنێ. تۆ، ژیانی درندە، ژیانی تاڵ نی وا مرۆڤان بکێشێتە نێو گێژاوی سەرلێشێواوی و بەجێیان بهێڵێ. تۆی کە بە خۆپەروەری و خوێڕیگەری و خۆپەسەندی و لووتبەرزی و بەرچاوتەنگی و ڕژدوتەماعی مرۆڤ پێدەکەنی، پەردە بەسەر کارەنەشیاوەکانیدا دەکێشی.

کێیە شەڕابی کوشەندەی تۆ نەخواتەوە؟ مرۆڤ ڕوخساری تۆی ترسناک نواندوە و لێت بێزارە، فریشتەی بەورشەی وەکوو دێو و درنج نیشان داوە. بۆ لە تۆ دەترسێ؟ بۆ بوختانت پێدەکا؟ تۆ تیرۆژی، گرشەدار و بریقەداری بەڵام تۆیان تاریک و ڕەش پێناسە کردوە. تۆ پەیامهێنەری پیرۆزی و شادمانی بەڵام لە بارگاتدا شیوەن دەگێڕن. تۆ پەیامهێنەری گەرمەشینان نی تۆ ئاوپرژێنکەری دڵانی سیسبووی. تۆ دەلاقەی هومێد بە ڕووی ناهومێداندا دەکەیەوە. تۆ میوانداری کاروانی ماندوو و شەکەتی ژیانی و دەیحەسێنیەوە، تۆ شیاوی ستایشی. تۆ پایەدار و نەمری...

بلژیک _ 1305